به ناو خوا

# بابۆڵە برینجی خوڵخوڵ


نووسینی :

ساساکی یامادا

نۆبۆروو سانپێی

وه رگێڕ له زمانی ژاپۆنیه وه :

بینا بێورانی



انتشارات دانشگاه کردستان

پێدا چوونه وه :

عه دنان به رزنجی

نیگار :

موحه مه د ڕه زا موورادی

قیمت : ۲۰۰۰ تومان

مرکز پخش : سنندج ، چهار راه شهدا
پاساژ عزتی ، کتاب کانی
تلفن : ۵۲۵۹ ۲۲۲ ۸۷۱ (۹۸+)

| | |
|---|---|
| سرشناسنامه : | بیورانی ، بینا ، ۱۳۷۶ - |
| عنوان و نام پدیدآور : | بابوله برنجی خول خول / کوکردنه و ه وه رگیر له بینا بیورانی ، تصویرگر ؛ محمد رضا مرادی. |
| مشخصات نشر : | سنندج ؛ دانشگاه کردستان ، ۱۳۸۸ . |
| مشخصات ظاهری : | ۳۶ ص.: مصور(رنگی)؛ ۱۷ ۲٤ س م. |
| شابک : | 978-964-2797-18-9 |
| وضعیت فهرست نویسی : | فیپا |
| یادداشت : | کردی |
| یادداشت : گروه سنی : | ب ، ج . |
| موضوع : | داستان های تخیلی |
| رده بندی دیویی : | ۱۳۰ دا ۱۳۸۸ ب ۹۸۶ ب |
| شماره کتابشناسی ملی : | ۱۹۱۳۲۷۲ |

له ڕۆژگاری قه دیم باپیره و دایه پیره یه ک پێکه وه ده ژیان. باپیره هه موو ڕۆژێک ئه چوو بۆ سه ر مه زرا و هه تا ئێواره ئیشی ده کرد. کاتێ که برسی ده بوو، له سێبه رێک داده نیشت و تۆپه لە برینجه کانی ده خوارد که دایه پیره هه موو ڕۆژێ بۆی درووست ده کرد. ڕۆژێ له ڕۆژان لای نیوه ڕۆ وتی: « ئای که چه نده برسیمه! با دانیشم با بۆله برینجه کانی خیزانم بخوم که زور خوشن ...» به ئیشتیا خه ریکی خواردن بوو له ناکاو تۆپه له برینجێک له ده ستی هه لخلیسکا و تلاوتل له ده ستی ده رچوو. باپیره به هه له داوه به شوێن تۆپه له برینجه که دا غاری ده کرد: « ڕاوه ستە، ڕاوه ستە! بۆ کوێ ده روی؟ » به لام تۆپه له برینجه که هه ر تل ده بۆوه، هه تا که وته ناو کونێک. باپیره ش گه یشته لای کونه که، که گوێی هه لخست، گوێی له ده نگی گۆرانی بوو که له ناو کونه که وه ده هات: " ئۆموسوبی کۆرۆرین، ئۆموسوبی کۆرۆرین ... (خول خول برینج به تۆپه ل، بابۆله برینج به کۆمه ل ...)"

باپیره وتی: « ئێ! چه ند سه یره!! با تۆپه له برینجێکی دیکه بخه مه ناو ئه م کونه!» ئه مجا تۆپه له برینجێکی دیکه ی خسته ناو کونه که و دووباره گوێی هه لخست ... هه میسان ده نگی گۆرانی هات: " ئۆموسوبی کۆرۆرین، ئۆموسوبی کۆرۆرین ... (خول خول برینج به تۆپه ل، بابۆله برینج به کۆمه ل ...)"

باپیره وتی: « ئێ! بلێی ئه م ده نگه ی چی بێت؟!

باپیره ڕۆیشته وه بۆ ماڵه وه و به سه رهاته که ی بۆ دایه پیره گێڕاوه .
ئه مجا داوای لێ کرد که بڕێک بابۆڵه برینجی دیکه ی بۆ ساز بکات.
دایه پیره پرسی: « ده چیته وه بۆ سه ر مه زرا؟»
باپیره وڵامی داوه: « نا! ده ڕۆم گوێی له گۆرانی بگرم!»
دایه پیره وتی:« که وابێ بابۆڵه برینجی زۆرت بۆ درووست ده که م.» ئه مجا ده ستی کرد به درووست کردنی بابۆڵه برینج.
...
باپیره وتی: « ده ستت خۆش بێ ئافره ت، ئه وا من ڕۆیشتم.»
دایه پیره ش به ڕێی کرد: « خوات له گه ڵ به سه لامه ت.»
باپیره هه میسان چوو بۆسه ر کونه که و تۆپه ڵه برینجێکی خسته ناو کونه‌که ... دیســـان ده نگه‌که هاته وه : " ئۆموسوبی کۆرۆرین ، ئۆموسوبی کۆرۆرین ... ( خول خول برینج به تۆپه ڵ، بابۆڵه برینج به کۆمه ڵ ... )"
جا په یتا په یتا تۆپه ڵه برینجی ئه خسته ناو کونه که و خۆیشی ده ستی کرد به سه ما و هه ڵپه ڕین که له ناکاو قاچی هه ڵخلیسکا و که وته ناو کونه که! هاواری کرد: « فریام که ون! فریام که ون !!...»
به ڵام هه ر ئه و ده نگه ئه هات: " ئۆموسوبی کۆرۆرین ، ئۆموسوبی کۆرۆرین ... ( خول خول برینج به تۆپه ڵ، بابوله برینج به کۆمه ڵ ... )"

باپیـره وتی: «خوایه ئێره کوێیه ؟!» له ناکاو چاوی به جه ماوه رێکی زۆر مشکی چکۆله که وت که تێکرا وتیان: «سه لام! با پیره. فه رموو دانیشه تا بحه سێیته وه.»

باپیـره زانی که که وتووه ته ناو کونه مشکان! به سه ر سـوڕمانـه وه وتی: « سه لام مشکه کان!»

جه ماعه تی مشکه کان وتیان: «چوونکه تۆ تۆپه ڵه برینجت بۆ ده خستین ، ئێمه یش نان برینجیت بۆ درووست ده که ین.»

باپیـره وتی:«من نان برینـجیم زۆر پێـخۆشه، سپاس.»

مشکه کان زۆریان نان برینجی درووست کرد. با پـیـره تێر و پڕ نـان برینـجی خـوارد و له گـه ڵ مشکه کـان زۆر هه ڵپه ری . ئه مجا بیـری که وتـه وه که دایه پـیره له ماڵه وه چاوه ڕوانیه تی . هه ستا و ویستی له مشکه کان ماڵاوایی بکات. مشکه کان وتیان: «باپـیره ئێمه کاتێـکی خۆشمـان له گه ڵ تۆ به سه ر برد. زۆر سپاسی تۆیش ئه کـه ین کـه ئه و هه موو برینجه ت بۆهێناین» ئه مجا دوو مجریان پێ نیشان دا که یه کیان گه وره و یه کیان چکۆله بوو!

وتیان :« ده توانی یه کێک له م مجریانه هه ڵبژێری و به دیاری بیبه یته وه بۆ ماڵ! »
باپیره دڵی نه هات که مجریه گه وره که هه ڵ بگرێ. له دڵی خۆیدا وتی: هه رچی تیا بێ، بۆ مشکه کان زیاتر پێویسته نه بۆ من. جا بۆ یه مجریه چکۆله که ی هه ڵبژارد و ماڵاوایی کرد و به ره و ماڵ گه ڕایه وه.
که گه یشته ماڵه وه، دایه پیره خێرا پرسیاری کرد:« ئه مه چیه له باوه شت گرتووه؟»
باپیره حیکایه تی کونه مشکانی بۆ ژنه که ی گێڕاوه و دوو به دوو مجریه که یان کرده وه، سه ریان سوڕما !
وا یان ده زانی که خه و ده بینن، چوونکه مجریه که پڕ بوو له زێڕ و شتی به نرخ!!
له و کاته دا ژنی دراوسێکه یان که ئاگای له م ڕووداوه بوو، به هه له داوه ڕۆیشت بۆلای مێرده که ی و حیکایه ته که ی بۆ گێڕایه وه ئه مجاوتی:« منیش تۆپه ڵه برینجت بۆ درووست ئه که م و تۆ بیبه بو کوونه مشکان!»
مێرده که ی وتی:« ده ی باشه زووکه.»
جا پیاوه که بابۆڵه برینجه کانی هه ڵگرت و رۆیشت بۆ مه زرا و زۆر گه ڕا تا کونه مشکانی دۆزیه وه. ده ستی کرد به خستنی بابۆڵه برینج بۆ ناوکونه که.
ئه مجا گوێێ هه ڵخست، گوێی له ده نگی گۆرانی بوو:" ئۆموسوبی کۆرۆرین، ئۆموسوبی کۆرۆرین... (خول خول برینج به تۆپه ڵ، بابۆڵه برینج به کۆمه ڵ...)"
وتی:« وا دیاره ئێره یه.»
ئه مجا به په له خۆی خسته ناو کونه که.

که گه یشته خواره وه مشکه کان وتیان: «سه لام باپیره! ده ستت خۆش بێ بو ئه و با بۆڵه برینجه خۆشانه، به ڵام بۆچی وا به په له ی؟ وه ره با کاتێکی خۆش پێکه وه به سه ر به رین و ئێمه یش نان برینجیت بۆ درووست بکه ین.»

باپیره ی دووهه م به درۆ وتی: « نا نا ئه من نان برینجیم پی خۆش نییه!! هه ر دیاریه که م بده نێ ،زۆر به په له م.»

مشکه کان وتیان: «به سه ر چاو. هه رئێستا دیارییه که ت بۆ دێنین.»

مشکه کان به هه ڵه داوه دوومجری گه وره و چکۆله یان له به ر پێی باپیره ی دووهه م دانا.

باپیره ی دووهه م وتی: «ئه من گه وره که یش و چکۆله که یشم ده وێ!»

ئه مجا ده نگی پشیله ی له خۆی ده رهێنا تا مشکه کان بترسێنێ!

"میاو! میاو! ئه من پشیله یه کی دێزم... میاو! میاو!"

مشکه کانیش له ترسان هه ریه ک به لاییکدا هه ڵاتن!

که مشکه کان هه ڵاتن، رووناکایی له کوونه که براو چاو چاوی نه ئه بینی!

باپیره وتی: «خودایه ئێره کوێیه؟ من له کوێم؟»

به ڵام ته نیا گوییێ له ده نگی مشکه کان بوو که ده یانوت:

«چوونکه ئێمه ت ترساند، ولات ئاوا تاریک بووه!»

باپیرەی دووهەم دیسان وتی: «خودایە ئێرە کوێیە؟ من لە کوێم؟»
ئەمجا هەر چۆنێک بوو مجری گەورە و چکۆلەی دۆزیەوە، هەڵیگرتن و بە شوێن
درگای کوونەکەدا دەگەڕا. بەڵام لەو تاریکایەدا ڕووی لە هەر کوێیەک دەکرد،
ڕووناکایی نەدەدی!! هەرچەندەیش لە مشکەکان پاڕاوە کە درگای دەرەوەی
پێ نیشان بدەن، مشکەکان هیچ وڵامێکیان پێ نەداوە!!
جا باپیرەی دووهەم هەتا هەتا هەرخەریکی هەڵکەندنی عەرز بوو تا بتوانێ خۆی
دەرباز بکات!

# ئیـشی داركونكه‌ره

نووسینی :

تامائی هایاشی بارا

وه رگێڕانی :

بینا بێـورانی

دارکونکەرە  درگای  دووکانی  کردەوە. دووکانێ کەتایبەت بە خۆی بوو.

دارکونکەرە لەنێو  تەواوی  دارەکانی دارستاندا، دارێکی هەرە  چاکی هەڵبژارد و تابلۆیەکی  بۆ دووکانەکەی  دروست  کرد و لیێ  نووسی:

«دووکانی  دەنگ و ئاهەنگ»

دارکونکەرە  تۆزێ  بۆی ڕوانی  و  بیری  کردەوە  کەئەو  نووسراوە تەواو  نیە؛

جا  بۆیە بە  خەتێکی  ورد  ئەم  دێڕەی  پێ  زیادکرد: «وەرن  گوێ  لە ئاهەنگی  دڵنشین  و  زیندوو بگرن. پێنج خولەک، تەنیا  بە سەد لیرە!»

کەروێشکێک بە دوو گوێچکەی قیت و جووانی، لەڕێوە هات و وتی:
«تەنیا سەد لیرە! بڵێی چۆن دەنگێک بێ؟»
ئەمجا ڕوانیە پێڕستەکەو دەنگێک کە لە قەراغی پێڕستەکەدا لێی
نوسرابوو «دەنگی بوونا *»
هەڵیبژارد و داوای ئەو دەنگەی کرد.
دارکونکەرە وتی: «بەسەر چاو! دەی با بڕۆین.»

*بوونا، دارێکە لە دار بەڕوو دەچێت و بە ئینگلیسی پێی دەلێن Beech

ئەمجا دوو بە دوو بەرەو دارستانی «بوونا» ڕێکەوتن. دارکونکەرە لە سەر داری «بوونا»وە هاواری کرد: «کەروێشک! ئەوە دەست پێ ئەکەم، حازری؟»

کەروێشک لە ژێر دارەکەوە سەری ڕاوەشاند کە بەڵێ حازرم.

دارکونکەرە بە تەواوی هێز و تواناوە بە دەنووکە تیژ و درێژەکەی لە جەستەی دارەکەی دا:

کۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆن...

ئەم دەنگ و هەرایە تەواوی دارستانەکەی لە بەرگرت.

تا ئەو کاتەی کە دەنگەکە دوایی هات، کەروێشک و دارکونکەرە ڕاوەستابوون و گوێیان ئەگرت.

هەردووکیان ئەوەندە دەنگەکەیان پێ خۆش بوو کە زیاتر لە پێنج خولەک گوێیان لێ گرت.

***

لە دارستانی «بوونا» باران دەباری.

دارکونکەرە چاوی لە ئاسمان بڕیبوو. بیری لە پێڕستی تازە دەکرد کە لە ناکاو دەنگێک وتی: «سەلام دارکونکەرەی بەڕێز! ئەوە چی ئەکەی لەو سەرەوە؟»

دارکونکەرە ڕوانی بۆخوارەوە ، چاوی بە بنەماڵەی مشک کەوت کە لە ژێر باراندا هەریەکەو گەڵایەکی نیلوفەریان دابوو بە سەریاندا و ڕوویان کردبووە ئەو تا قسەی لەگەڵ بکەن. جابۆیە دەموچاویان تەڕ ببوو.

دارکونکەرە سەرو پۆپنە تەڕەکەی ڕاوەشاند و وڵامی داوە:
«پێڕستی تازەی دووکانەکەم ساز دەکرد.»

مشکه کانیش وتیان:«ئێ ! بە ڕاستە؟!»

دارکونکەرە وتی:«بەڵێ، هەر ئەمڕۆ سازم کردووە.»

مشکەکان وتیان:«ئێ!»

دارکونکەرە وتی:«بەڵام چونکە دڵنیا نیم ئەم پێڕستە بۆ بەیانیش بەکەڵک بێت، نازانم بینووسم یا نەینووسم؟!»

مشکەکان وتیان:«ئێ! کەواتە پێڕستێکی تایبەتیە.»

دارکونکەرە وتی:«بەڵێ. دەنگێکی تەواو تایبەتیە.»

مشکه کان وتیان : « که وابێ ئێمه کاتێکی باش گه یشتین !
ئه م ده نگه تایبه ته ش هه ر به سه د لیره؟»
دارکونکه ره وتی : « نا ، ئه مڕۆ خۆڕاییه ؟ »
مشکه کان وتیان : « ده ی زۆر باشه ! ماوه یێکه بیستوومانه
« دووکانی ده نگه کان » کراوه ته وه .
ئیسته ش هه مووومان هاتووین بۆ بیستنی ئه م ده نگه
دڵنشینانه ! »
دایکی مشکه کان وتی : « ئه مڕۆ هه ر له به یانی زووه وه
باران ده بارێ ، نه متوانی جله کان بشۆم ، حه وشه و بانیشم بۆ
خاوێن نه کرا .

جابۆیە بێتاقەت بووین و هاتین بۆ ئێرە!»
بەچکە مشکەکان تێکڕا وتیان: «گژ و گیا هەموو تەڕ بوون، جابۆیە نەمانتوانی ئۆسومۆ* یان تۆپ تۆپێن بکەین! بەڵام حەلەزون (شەیتانۆکە) پەکی ناکەوێ!»
بەچکە مشکەکان تێکڕا وتیان: «دارکونکەرە گیان! بێزەحمەت دەنگێکی خۆشمان بۆ بگرە!»
دارکونکەرە باڵی لێدا و چوو بۆلای مشکەکان و وەڵامی داوە: «بەسەر چاو!»
بەچکە مشکەکان کەوتنە هەرا و هووریا.

Osumo ئۆسومۆ بە زۆرانی ژاپۆنی دەڵێن.

دایک و باوکیشیان هه ر ده یانوت: « به سه . بێده نگ بن! با گوێ له ده نگی تایبه تی ئیمڕۆ بگرین.»

هه ر دوو دانه به چکه مشکه که بێده نگ، به چاوه گه شه کانیان ماتڵ بوون.

دایک و باوکیان ڕوویان کرده دارکونکه ره و وتیان: « ئێمه ئاماده ین!»

دارکونکه ره وتی: « زۆر چاکه! جا چاوتان ببه ستن و گوێ ڕادێرن!»

مشکه کان وایان کرد و گوێیان ڕاداشت:

شابا ، شابا ، شابا...

پاچی ، پاچی ، پاچی...

پی چی ، پی چی ، پی چی...

پاری ، پاری ، پاری...

دوا، دوا ، دوا...

زاوا، زاوا، زاوا...

دەنگی گۆرانی و باران تێکەڵ ببوون. باران لەگەڵای داری «بوونا» و لە عەرز و لە چەتری نیلوفەری دەدرا. لەدوورەوە لە نێو دارستانیش هەر دەنگی باران ئەهات.

– بەڕاستی دەنگی باران چەن خۆشە!

– ڕاست دەکەی. منیش دەیبیسم.

– ئای کە چەن دڵنشینە!

– تا ئیستێ بە ئاهەنگی بارانم نەزانیبوو!

– ...

وردە وردە باران خۆشی کردەوە و دەنگی تایبەتی ئەو ڕۆژەش دوایی هات.

مشکەکانیش دەم بە پێکەنین، هێواش هێواش چاویان کردەوە.

## دوشه ممه

بەچکە ڕێوییێک لە قەراغی پردێک سەتڵێکی زەردی دۆزییەوە ،وتی:«ئەمە هی کێیە؟»
بەچکە ڕێوی بۆ ناو سەتڵەکەی ڕوانی، تەنیا چەند دڵۆپ ئاوی تیا بوو.
دانیشت، دەموچاوی خۆی لە سەتڵەکە نزیک کردەوە، دەموچاوی خۆی تیا بینی.ئەمجا زمانی دەرهێنا و پێکەنی. هەستا و سەتڵەکەی بە دەستەوە گرت. دەتگوت بۆ ئەو درووست کراوە!
سەتڵەکەی لە بەر دەموچاوی ڕاگرت و بۆ دەورو بەرەکەی دەیڕوانی. دەیگوت شایەت ناوی خاوەنەکەی لێ نووسرابێ! بەڵام ناوی لێ نەنووسرابوو!
وتی:«تازەیە! بڵێی هی کەسێک بێت؟!»
بەچکە ڕێوی لە پێشدا ئاواتی بوو سەتڵێکی بەم جۆرەی هەبێ،سەتڵێ کە سوور نەبی، شینیش نەبێ، زەردی زەردبێ!»
سەتڵەکەی لە سەرجێی خۆی دانا و بە هەڵەداوە چوو بۆ لای کەروێشک و بە هەناسەبڕکێ وتی:«قەراغی پردەکە سەتڵێکی زەردی لێیە، تازەیەو زۆر جوانە،بەڵام نازانم هی کێیە؟!»
کەرۆیشکەکە سەتڵە سوورەکەی خۆ هەڵگرت و لەگەڵ ڕێوی وەڕێ کەوت. لەلای چەمەکە چاویان بە بەچکە ورچ کەوت کەسەتڵێکی شین وکەل وپەلی ماسی گرتنی پێ بوو.
بەچکە ڕێوی بە بەچکە ورچی گوت:«قەراغ پردەکە سەتڵێکی زەردی لێیە، تازەیەو زۆر جوانە، بەڵام نازانم هی کێیە؟!». ئەمجا بە پەلە بەرەو پردەکە هەڵات، کەروێشکەکە و ورچەکەش بە شوێنیدا هەڵاتن...
سەتڵە زەردەکە هەر لەوێ بوو! کەروێشک دەور و بەری خۆی تاقی کردەوە و وتی:« ئێرە چەندە گوڵی لێیە!»

ورچەکە بۆ ناو سەتڵەکەی ڕوانی و لە بەچکەڕێوی پرسی:«تۆ ئەم ئاوەت تێ کردووە؟»
بەچکەڕێوی وتی:«نا من تیێم نەکردووە، کاتێ کە دۆزیمەوە، ئەم ئاوەی تێدا بوو.»
بەچکەورچ وتی:«بڵێی کێ تیێی کردبێ؟» بەچکە ڕێوی و بەچکە کەروێشکیش تێکڕا
وتیان:«بڵێی کێ تیێی کردبێ؟جا ئەمجا سێ بە سێ تمیشای ناو سەتڵەکەیان کرد و بیریان لێ
ئەکردەوە!»
کەروێشک وتی:«سەتڵی ڕاکۆن کە ڕەشە؟»
ڕێوی وتی:« سەتڵی بەرازیش کە سەوزە!»
ورچ پرسی:«سەتڵی مەیموون چ ڕەنگە؟»
ڕێویش بەمەلوولیەوە وڵامی داوە؟«مەیموونیش وەکوو من سەتڵی نییە!»
ورچ بە ڕێوی وتی:«ئادەی ئەم سەتڵە زەردە بەدەستەوە بگرە!»
ڕێوی بەدەستی ڕاست سەتڵەکەی هەڵگرت و بەنازێکەوە وتی:«ئاوا باشە؟ جوانم؟»
ورچ بە پێکەنینەوە وتی:«بۆ تۆ زۆر جوانە،هەر دەڵێی بۆ تۆ دروووست کراوە»
ڕێوی سەتڵەکەی لە لای قاچی خۆی دانا و وتی:«بریا وابێ!»
ورچ وتی:«دەی باشە، لێرە دایدەنێین، ئەگەر هیچکەس لێی نەپرسی ،دەبێتە سەتڵی
بەچکەڕێوی.»
کەروێشکیش وتی:« وایە! ئەگەر هەر هیچکەس لێی نەپرسی، یانی نایا نهەوێ ، کەواتە
دەبێتە سەتڵی تۆ.»
ڕێوی پرسی:«جا باشە تا کەی دای بنێین؟»
کەروێشک وتی:«بەیانی، دووبەیانی، سێ بەیانی، یان تا چوار بەیانی دای دەنێن.»
ورچ وتی:«نا ، چوار بەیانی زووە!! من دەلیێم زیاتر ڕاوەستین.»

ڕێوی پرسی:«یانێ تا کەی؟!»
ورچ وڵامی داوە:«ئەمڕۆ دوشەممەیە، تا دووشەممەی داهاتوو!»
ڕێوی پرسی:«یانێ یەک حەفتە؟!»
کەروێشک وتی:«بەڵێ یەک حەفتە!»

### سێ شەممە

بەیانی زوو، تاریک و ڕوون بەچکەڕێوی چوو بۆ قەراخ چۆم،لە سەر گژوگیا دانیشت و لە سەتڵەکەی ڕوانی!... لای نیوەڕۆ.ئەژنۆی لەباوەش گرتبوو،هەر بۆ سەتڵەکەی ڕوانی... ئێوارە سەتڵەکەی گرتبوو بە دەستەوە، ئەهات و ئەچوو...ئەمجا بەئاوی چۆمەکە سەتڵەکەی شوشتەوە...

### چوارشەممە

کەروێشک و ورچ بۆ بینینی سەتڵەکە چوون... ورچ وتی:«هێشتا لێرەیە.»
کەروێشک جوابی داوە:«ئەرێ! هێشتا هەر لێرەیە!»
ڕێوی وتی:«ئەگەر تا دووشەممە هەر لێرە بمێنێ، زۆر باشە!!»ئەمجا سەتڵەکەی بە دەستەوە گرت و لە قەراخ چۆمەکە دانیشت و وەک بڵێی خەریکی ماسی گرتنە، ئەمجا هەروا کە چاوەکانی ئەدرەوشایەوە، سەتڵەکەی دەهێنا و دەیبرد...

## پێنج شەممە

سەتڵی زەرد هەر لەسەرجێی خۆی مابوو.
بەچکەڕێوی سەتڵەکەی پڕلە ئاو کرد و هێدی هێدی لەو نزیکانەوە خەریکی ئاوەدێری دارێک بوو. پێی وابوو کە خەریکە دارسێوەکەی ماڵی خۆیان ئاوئەدات... لە خەیاڵی خۆیدا ئەو سێوە سوورانەی کە لەسەر عەرز کەوتبوون، کۆی ئەکردن و ئەیخستە ناوسەتڵەکە و ئەیبرد بۆ ورچ و کەروێشک... جا پێکەنینی بە خۆی دەهات!...

## هەینی

سەرلەبەیانی باران دەباری. بەچکەڕێوی چەتری بەدەستەوە گرت و چوو بۆ لای سەتڵەکە... سەتڵەکە هەر لەوێ بوو... کاتێ لەژێر لێزمەی بارانەوە، چاوی بە سەتڵەکە کەوت، فرمێسکی لە چاو هاتە خوار...

## ئێوارەی هەینی

باران لەسەرخۆ دەباری. بەچکەڕێوی بۆ تمیشاکردنی سەتڵەکە دیسانەوە چوو...دی کە... هەرلە جێگای خۆیەتی...
لە دڵی خۆیدا وتی: «دووشەممە سەتڵی زەرد دەبێتە سەتڵی من» ئەمجا سەتڵەکەی سەرەوخوار کردەوە و بەچیلکەیەک پێدا دەیماڵی و گۆرانی دەخوێند...

## شەممە

سەتڵەکە لەژێر ئاسمانی شیندا ئەدرەوشایەوە. ڕێوی سەتڵەکەی سەرەوخوار کردو ئەو تۆزە ئاوەی کە تێدا بوو، ڕژاندی. ئەمجا بە چیلکەیەک لە بن سەتڵەکە ناوی خۆی نووسی: کیسونێ

## یەک شەممە

سەتڵەکە هەر لەسەر جێی خۆیدا مابوو.

ورچ و کەروێشکیش بۆ تمیشا کردنی سەتڵەکە هاتن... ورچ وتی: «پەرۆش مەبە! بەیانی ئەم سەتڵە دەبێتە سەتڵی تۆ.» بەچکە کەروێشک وتی: «تەنیا یەک شەوی تر ڕاوەستە!»

...ڕێوی پێش خەوتن، بۆ تمیشاکردنی سەتڵەکە هاتەوە. مانگە شەوێکی جوان بوو!. سەتڵەکە هەرلەوێ بوو... با لێیدەدا و دەنگی لێدەهات. بەچکەڕێوی لە دڵیا وتی: «ئەگەر بیبات چ بکەم!.» ڕێوی سەتڵەکەی پڕ لەئاو کردو دیسان لە جێگای خوێ دایناوە.

مانگەشەو کەوتبووە ناو سەتڵەکە. مانگە شەوی زەرد کە هەر وەکوو سەتڵەکە زەردبوو، لەسەر ئاوەکە دەلەرزا، دەتگوت پێدەکەنێ.

ڕێوی دەستی خستە ناو ئاوەکە و لەگەڵ مانگماڵئاوایی کرد و بەرەو ماڵەوە گەڕایەوە...

نیوەشەو ڕێوی بەخەبەرهات... نەرمەباێکی دەهات... بە پەلە هەستا، چوو تمیشای سەتڵەکە بکات... سەتڵەکە لەژێر مانگەشەوی تەلایێدا، ئەدرەوشایەوە.

لە ناکاو بایێکی توند هەڵیکرد و سەتڵەکەی لەگەڵ خۆی برد. بەچکەڕێوی دەستی درێژ کردەوە تا بیگرێ، بەڵام سەتڵەکە هەر چکۆلەتر و چکۆلەتر دەبوو... بەچکە ڕێوی هاواری دەکرد: «ڕاوەستە!!! ڕاوەستە...!!!» کەلە ناکاو چاوی کردەوە و زانی کە خەوی بینیوە...

تا بەیانی دوبارە خەوتەوە.

هەرچۆنێ بوو، دووشەممە هات... بەیانی زوو ڕێوی بۆ بینینی سەتڵەکە هەڵات...
بەڵام سەتڵەکە لەوێ نەبوو! ورچیش هات، وتی: «چەند حەیف بوو!!» کەروێشک وتی: ئیمڕۆ
بەختمان لەگەڵ نەبوو ! تۆ بڵێی چی لێ هاتبێ؟
ورچ و کەروێشک پێکەوە وتیان: «ڕەنگە کەسێک هاتبێ و هەڵیگرتبێ!!»
ڕێوی لە دڵی خۆیدا وتی: «چ فەرقێک دەکات کەچی بەسەر هاتووە؟... یەک حەفتەیش
زۆر نەبوو؟!!»
ڕێوی وای دەزانی کە سەتڵی زەرد هەر لەگەڵیەتی و سەتڵی زەرد هەر هی خۆیەتی و
هی کەسیتر نییە!
بەچکە ڕێوی تەنیا وتی: «قەی ناکە!»
ئەمجا سەری حەوا دا و تمیشای ئاسمانی شینی کرد...

ئاسمانی شین هەر درێژەی بوو!!

به هۆی ئەوەکە باوکم لە زانستگاکانی ژاپۆن دەیخوێند، چوار ساڵ لەوێ ژیانمان بەسەر برد. پۆلی یەکەم و دووهەم و سێهەمی سەرەتاییم لە قوتابخانەی ژاپۆنیەکان خوێند، زمانی ژاپۆنی فێر بووم. کاتێک کە گەڕاینەوە بۆ وڵاتی خۆمان، دایکم هەوڵی دا کە کەڵکی زیاتر لەم زمانە وەربگرم و کەڵکم بۆ منداڵانی وڵاتەکەیشم بیێت. جا بۆیە هانی دام کە سێ کورتە داستانی ژاپۆنی بە کوردی وەرگێڕم کە تا ئاخر پلەی کار و باری بڵاوکردنەوەی داستانەکان جێی نەهێشتم.

سپاس بۆ دایک و باوکی ئازیزم کە ئەم هەلەیان بۆ جێبەجێ کردم، سپاس بۆ مامۆستا عەدنان بەرزنجی کە هەوەڵ مامۆستای زمانی کوردیم بوو و زەحمەتێکی زۆری لەگەڵ من و داستانەکانم کێشاوە، هەروەها سپاس بۆ زانستگای کوردوستانی ئێران.

بینا بێورانی - دوانزە سالە - سنە

انتشارات دانشگاه کردستان

ISBN 978-964-2797-18-9

9 789642 797189